بەشێک لە پەیامەکانی نوور



# پەیامی حەشر

بەدیعوززەمان

## سەعیدی نوورسی

دایناوە

فاروق رەسوول یەحیا

کردوویە بە کوردی

www.iqra.ahlamontada.com
منتدى اقرأ الثقافي

بسم الله الرحمن الرحیم

پەیامی حەشر

**ئەم پەیامە:**

* مامۆستا (**بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی**) بە زمانی تورکی دایناوە.
* مامۆستا (**ئیحسان قاسم صالحی**) لە زمانی تورکیەوە کردوویەتی بە عەرەبی.
* (**فارووق ڕەسووڵ یەحیا**) لە عەرەبیەوە کردوویە بە کوردی.
* مامۆستا (**حسەین حەسەن کەریم**) بەم کوردیەدا ڕۆشتووەتەوە و لەگەڵ دەقی عەرەبیەکەدا بەراوردی کردووە.
* مامۆستا (**عەبدولکەریم عەبدوڵڵا ڕەفعەت**) پیایدا ڕۆشتووەتەوە و لەگەڵ دەقە تورکیەکەدا بەرامبەری کردووە.
* چاپی یەکەم: هەولێر ١٤١٦ك - ١٩٩٦ز
* چاپی (شەرعی و بژارکراوی) دووهەم: بەیروت ١٤٣٢ك - ٢٠١١ز
* لەسەر ئەرکی وەرگێڕ لە چاپ دراوە.
* (ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا) نەخشەی بەرگی کێشاوە و سەرپەرشتیی چاپی کردووە.
* هەموو مافێکی چاپ و، لەبەرگرتنەوە و، بڵاوکردنەوە و، هەر چەشنە دەست تێوەردانێك، بە پێی شەرع و یاسا و بەها ئایینی و مرۆڤایەتیەکان، پارێزراوە بۆ وەرگێڕ.
* ژمارەی سپاردنی (١٤١)ی ساڵی (١٩٩٦)ی لە وەزارەتی ڕۆشنبیریی هەرێمی کوردستان پێ دراوە.

بەشێك لە پەیامەكانی نوور

# پەیامی حەشر

بە دیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

كردوویە بە كوردی

# پێشەکیی وەرگێڕ

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين حمداً يوافي نعمه ويكافئ مزيـــده، وصلـــوات الله وسلامه على نبينا محمد وعلى إخوانه من الأنبياء والمرسلين وعلى آله وصحبه وتابعيه إلى يوم الدين.

(لە ڕۆژێکـی خـەملاوی وەرزی بـەهار و، لێـواری دەریاچەیـەکی کـپ و هێمنی تـا ئاسۆ کشـاودا، مامۆستا نوورسی سـەرنجی بـیر و ئەندێشـەی لـە بوونەوەرانی دەوروبەری خۆی بە قووڵـی ڕاهێشتبوو.. بە وردی دەیڕوانی‌یە ئاوی ئەو دەریاچە ساف و ئارامەی بەردەمی و، لوتکەی چیا بڵندەکان کە بـە دارستانی چڕ داپۆشرابوون و، سەوزەڵانیی ئـەو دەشـت و دەرەش کـە – هـەتا چـاو بـڕی بکردایـە – بـە جۆرەهـا گوڵـزار و ڕێحانـەی ڕازاوە و ڕەنگـین ئارایشت درابوون..

قەشـەنگی و نـاوەزایی ئـەو دیمەنـە و، جوانیـی بوونـەوەران و، وردەکـاریی سنعەت لە هەموو یەکێکیاندا، دڵی ئەویان نوقمـی حەپەسـان کـرد و، هەستی سەرسامییان لـەلا هـەژاند، بە تایبـەت لـە ڕووی ژیانــەوەی سـەرجەمی ئـەو ڕووەك و بێ گیانانەی کـە بـە درێژایـی زستان کفنـی بـەفر و سـەهۆڵبەندانیان پۆشیبوو، کەچی دەیبینی وا سەرلەنوێ گیانیان بە بەردا کراوەتەوە!

لـەتاو ئـەم دیمەنـە سـەرنج بزوێنــە و، بـەدەم هاتوچۆکردنـەوە لــە لێــواری بەشێکی ئەو دەریاچەیەدا و بە بێ ویستی خۆی، نزیکـەی چـل جـار ئـەم ئایەتـە پیرۆزەی لەبەر خۆیەوە دووپات کردەوە کە دەفەرموێ:

﴿فَانظُرْ إِلَى آثَارِ رَحْمَتِ اللهِ كَيْفَ يُحْيِي الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ ذَلِكَ لَمُحْيِي الْمَوْتَى وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (الروم: ٥٠)..

هەتا لە ئاکـامدا خـوای گـەورە سروەیەکی فێنکـی بـە سنگ و دەروونـی بەخشی و، لە ڕێژنەی ڕووناکی‌یـەکانی ئـەم ئایەتـەوە نوورێکـی هاویشـتە نـاو دڵیـەوە و، لـە ڕێی ئـەو نـوورەوە هـەندێك لە واتـا مەزنەکانی ئەم ئـایەتە پیرۆزە - هێدی هێــدی - ڕێیـان بۆ نـاخی دڵ و دەروونـی ئـەو گرتەبـەر. مامۆستاش ئەمەی وەك هەلێك قۆزتەوە و یەکسەر ئەو واتایانەی بـۆ یـەکێك لـە قوتابیـانی هاوگەشتی خۆی درکاند، کـە ئـەویش - چاپوکانـە - لـە زاری مامۆسـتای وەرگرتـن و ڕاستەوخۆ نووسـینیەوە، لــە ئـەنجامدا ئـەم پەیامــەی بەردەسـتی خوێنەری بەڕێزیان لـێ پێکهات.

ئەم ڕووداوەش لە ساڵی ١٣٤٢ك (١٩٢٧ز)دا بوو، کە ئەو دەمە مامۆستا نوورسـی لـە گونـدی "بـارلا"ی نـاو چیاکـانی تۆرۆس و سـەر بـە پارێزگـای "ئیسپارتە"ی باشـووری خۆرئـاوای تورکیـادا، دوورخـراوە و دەستبەسـەر بووە)[1].

لە ڕاستیدا پەیامی "حەشر" یەکێکە لەو دەیان پەیامانەی نوور کە مامۆسـتا نوورسـی لــەو بــەروارەوە هــەتا ســاڵی ١٩٥٠ز ســەرگەرمی نووســین و بڵاوکردنەوەیان بووە. لەم پێناوەشدا هێندە ئەشکەنجەی جۆراوجۆر و ئازاری سەختی چەشتووە کە مەگەر تەنها مەردانی گەورە ئیماندار و خـاوەن عـەزم و

(١) ئەم دەقەی سەرەوەم لـە پێشـەکی‌یەکەی مامۆستا "ئیحسـان قاسـم سـالحی"یەوە کردووە بە کوردی کە بۆ چاپە عەرەبی‌یەکەی ئەم پەیامەی نووسیوەتی. بڕوانە: رسالة الحشر ص٥.

هیممەتی بڵند بتوانن خۆیانی لە بەردەمدا ڕابگرن و، هیچ کام لەو گیروگرفتانە لەرزەی پێ نەخەن و، دڵنیایی بیروباوەڕەکەی لە جێی خۆیدا نەلەقێنن. خوێنەری بەڕێز دەتوانێت بە خوێندنەوەی باس و کتێبەکانی مێژووی ژیانی و، ئەو پەیامانەش کە چەردەیەکیان لە بەسەرهاتەکانی ئەو نووسیوە، هەندێکی لە ڕادەی کۆڵنەدان و خۆڕاگریی مامۆستا نوورسی بۆ دەربکەوێت و، بزانێت تا چەندە متمانەی بە "ڕاستی" و "لەسەر حەقبوون"ی باوەڕ و بەڵگە چەسپێنەرەکانی ئیمان بووە.

بەڵام لێرەدا دەمانەوێت ئاماژەیەکی خێرا و پوخت بۆ ڕۆڵی گرنگ و، کاریگەریی سەرنج ڕاکێشی ئەم پەیامە بکەین لە ڕووی دڵنیایی بەخشین بە خوێنەرانی و، ڕزگارکردنیان لە دەردەکانی گومان و دوودڵی سەبارەت بە ڕاستییەکانی زیندووبوونەوە و، حەشر و، لێپرسینەوە و، تۆڵە و پاداشتی ئەودنیای هەمیشەیی.

دەبێ لە پێشدا ئەوەش یادبخەینەوە کە ناوەرۆکی بنەڕەتیی "سەرجەمی پەیامەکانی نوور" بریتییە لە:

ڕوونکردنەوە و چەسپاندنی ڕاستی و پایەکانی ئیمان. ئنجا ئەو ڕێبازەش کە بۆ شیکردنەوە و لێدوانی ئەو باسانە گرتوویانەتەبەر، ڕێبازە فیترییەکەی قورئانی پیرۆزە کە مرۆڤ وەك یەکەیەکی کامڵ و سەربەخۆ دەبینێت و، لە یەك کاتدا مامەڵە لەگەڵ سەرجەم هەست و نەست و لایەنە "ژیری" و پێکهێنەرە سەرەکییەکانی تری ماهییەتی مرۆڤدا دەکات و، هیچ کاتێك لەبەر چڕکردنی بایەخدانی بە لایەنێك لایەنەکانی تری ئادەمیزاد پشتگوێ ناخات.

ئەم پەیامانە، بەپێی نەخشە و ڕێنمایی ئەم ڕێبازەی قورئانی پیرۆز، ئیمانێکی ڕەگداکوتاوی دامەزراو لەسەر بناغەی بەڵگەی "ژیری" و سەلمێنراوی ناو ناخی "دڵ"ی مرۆڤ پێشکەش بە "گیان" و سەرجەم

"ماهییەتی مرۆڤانەی" خوێنەر و لێکۆڵەرانیان دەکەن[١]. مامۆستا نوورسی ئەم چەشنە ئیمانەی ناوناوە "ئیمانی تەحقیقی" تاکو ناوێکی پڕاوپڕی ناوەرۆك و واتاکەی بداتێ و، لە هەمان کاتیشدا جیای بکاتەوە لە جۆرەکانی تری ئیمان کە لە بوارەکانی (زانستی کەلام)دا بە ئیمانی "تەقلیدی و ئیستیدلالی و شهوودی" ناوبراون[٢].

دەتوانین بڵێین: ئەم ئیمانە تەحقیقی‌یە پلەیەکی بڵندی ئیمان بە غەیبە، کە ناوەرۆکی ئیمانی "ئیستیدلالی" و پوختەی ئیمانی "شهوودی"شی لە خۆدا کۆ کردووەتەوە. چونکە مرۆڤی بەهرەمەندی ئەم چەشنە ئیمانە هێندە بەڵگەی چەسپێنەری لەمەڕ ڕاستی‌یەکانی ئیمان بە ڕوونی لە لا گەڵاڵە دەبن کە وەك بە چاوی دڵ بیانبینێت ئەو بابەتانەی ئاوا لەلا دەچەسپێن و، لە ئەنجامدا هیچ وەسوەسەیەکی شەیتانەکانی جینی و ئینس - چەندەش زۆر چڕ و پڕ و لەخشتەبەر بێت - ناتوانێت بەڵگەکانی ئەم ئیمانەی پووچەڵ بکاتەوە. تەنانەت ئەوەندە دڵنیایی لەو بابەتانەی ئیماندا بەدەست دەهێنێت کە نەك هەر دەتوانێت بەرامبەر بە پەلامار و لافاوی ئیلحاد خۆی ڕابگرێت، بەڵکو ئیمانەکەی هێندە مەحکەم و دامەزراو و لەڕادەبەدەریش دەبێت کە

---

(١) بۆ زیاتر شارەزابوون لەم ڕێبازە قورئانی‌یەی پەیامەکانی نوور، بڕوانە پێشەکیی پەیامی "پەنجەرەکان".

(٢) ئیمانی تەقلیدی (چاولێکەری) هی منداڵ و عەوامەکانە، کە بە چاولێکەریی کەسانی تری وەك زانایان باوەڕیان بە پایەکانی ئیمان پتر لەلا دەچەسپێت، بێ ئەوەی خۆیان پەی بە بەڵگەکانی زانایان لەم بابەتانەدا ببەن.. ئیمانی ئیستیدلالی(بەڵگەیی)ش هی زانایان و شارەزایانی زانستی کەلامە، کە بە بەڵگەی "ژیری" پایەکانی ئیمان دەچەسپێنن.. هەرچی ئیمانی "شهوودی"یشە ئەوا هی ئەولیا و خواناسانە، کە بە چاوی بەسیرەتی دڵ بەهرەمەندی بینینی ڕاستی‌یەکانی ئیمان دەبن. بۆ درێژەی ئەمانە بڕوانە: "عەقیدەی مەرزییە" ل ٥٠-٥٢ هەروەها "الوسیلة في شرح الفضیلة" ص ٥٦-٦٢ ، هەردووکیان لە نووسینی شاعیر و زانای پایەبەرز "مەولەوی". لێکدانەوەی مامۆستا "مەلا عەبدولکەریمی مودەریس" خوا لێیان خۆش بێت.

دەتوانێت - هەر بۆ خۆی - پووچەڵی و بێ بناغەیی گشت بەڵگەکانی ئەوان ببینێت و، تەلاری ئیلحادیش لە تانوپۆی جاڵجاڵۆکە گەلێ لاواز و فشەڵتر لە بەرچاوی دڵنیایی ئیمانەکەیدا دەربکەوێت.

وەك ئاشکرایە لای هەموان گرنگترینی پایەکانی ئیمان لە دوای "باوەڕکردن بە خوای گەورە و سیفەتە خاوێن و ناوە جوانەکانی" باوەڕهێنانە بە "ڕۆژی دوایی". چونکە ئەم دوانە تەوەرەی پایەکانی تری ئیمانن..

هەر لەبەر گرنگیی "باوەڕ بە دواڕۆژ"ە کە دەبینین قورئانی پیرۆز گەلێ بە چڕی بایەخی بەم پایە ئیمانی‌یە داوە و، بە چەندەها شێواز و لە چەندین ڕێگای جیاجیا و جۆراوجۆرەوە باسی حەشر و زنجیرە ڕووداوەکانی ئەودنیای هێناوەتە کایەوە و، گەلێ دیمەنی قیامەتیشی - وەك نموونە - خستووەتە پێش چاو، تاکو مرۆڤ بێدار بکاتەوە و، بۆ خۆی هەموو هەستە ئاشکرا و پەنهانەکانی بخاتە کار و، لەو نموونە و بەڵگانەی قورئانی پیرۆزەوە نوورێکی درەخشان ئاراستەی ناخی خۆی بکات و، بکەوێتە سەرنجدان لە بوونەوەرانی دەوروبەری و، لەم ڕێیەوە - بۆ خۆیشی - بەو دڵنیاییەی ئیمان کە قورئان لێی دەدوێت، شاد و بەهرەمەند ببێت.

زانایانی "کەلام" لە دێر زەمانەوە "باوەڕ بە حەشر"یان بە مەسەلەیەکی نەقلی - نەك عەقلی - داناوە و، لایان وابووە کە ناکرێت لە ڕێی ژیریی مرۆڤەوە پەی بەم بابەتە ئیمانی‌یە ببرێت و بدۆزرێتەوە.

ئەوان لەم بڕیارەیاندا لە "ڕاستی" لایان نەداوە، چونکە ئەگەر پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - لە ڕێی سرووشی خواییەوە گرۆی ئادەمیزادیان بۆ ئەم ڕاستی‌یە یەکجار بەرز و ڕەوایە ئاگادار نەکردایەتەوە، مەگەر کەسانێکی کەم و بە چەشنێکی تەماوی و نادیار، دەنا لە ڕێی بیر و ژیری‌یەوە بە تەواوەتی و ڕوونی پەی بەم لایەنەی ئیمان نەدەبرا، نەخوازەڵا لەو دەمانەدا کە مرۆڤ پتر لە شتانی ماددیدا ڕۆچووبێت و، ژیریشی دابەزیبێتە چاوی و، هەتا

مەودای بینینی چاوەکانی هەست و پەیبردنی بیر و ژیریشی پڕ بکات! ئنجا هەر لەم گۆشەیەوە ڕوویەکی میهرەبانی‌یە فراوانەکەی خواوەندمان لە ناردنی پێغەمبەراندا - درووديان لەسەر بێت - بۆ دەردەکەوێت.

بەڵام نابێ ئەو بڕیارەی زانایانی کەلام بەو واتایە لێکبدرێتەوە کە پێغەمبەران - درووديان لەسەر بێت - هەروەها کتێبەکانیان کە لە لایەن خوای گەورەوە بۆیان هێناوین، داوای تەسلیم بوون و باوەڕێکی چاولێکەریی بێ بەڵگە و پشت و پەنامان لێ بکەن، نەخێر. ئەوان هێندە بەڵگەی چەسپێنەریان هەر لە دەورو بەر و ژینگەی مرۆڤدا بۆ ئەم ڕاستی‌یە هێناوەتەوە کە ژمارەیان لە گەڵای ڕووەك و، بنجی گیا و، پەڕەی گوڵ و، چرۆی درەخت و، سەرجەمی زیندەوەران گەلێ زیاتر بێت!

قورئانی پیرۆز (کە دواهەمین کتێبی ڕەوانەکراوی خواوەندە و بە ئاخیرەمین پێغەمبەری هەڵبژاردەی خۆیدا بۆ سەرجەمی ئادەمیزادی ناردووە) بەڵگەکانی لەم ڕووانەوە نەك هەر یەك جار زۆر و زەبەندەن، بەڵکو ژیری و دڵ و بیری مرۆڤ و گشت هەستە پەنهانەکانیشی دەخاتەگەڕ بۆ سەرنجدانی ورد و بیرکردنەوەی ژیرانە لەو دیاردانەی ناو ئەم گەردوونە کە - وەك خۆری ڕۆشنا - دڵنیایی هاتنەدیی ئەودنیای پێ دەبەخشن و حەشری مرۆڤی لە لا دەچەسپێنن.

ئەم پەیامەش لەسەر نەخشە و ڕێبازەکەی قورئانی پیرۆز لەم بابەتانەدا هەنگاوی ناوە و، لە ناوەرۆکدا تەفسیرێکی خەستوخۆڵ و، سەرنجدانێکی وردی ناخی ئەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆزە کە "ژیری"ی مرۆڤ بۆ بەڵگە لەژمارە نەهاتووەکانی "حەشر" لە سەرانسەری گەردووندا بێدار دەکەنەوە و، "دڵ" و "دەروون" و "گیان" و سەرجەم هەستە پەنهان و لایەنە ناسکەکانی تریشی لەم ئاستە بڵندەی "بیرکردنەوە" و "دامەزراندنی کەسایەتیی پتەوی ئیمانداری دڵنیا"دا، هاوبەش دەکەن.

بۆ ئەوەی ئەم مەبەستە پتر ڕوون ببێت لە لامان، دەڵێین:

قورئانی پیرۆز هەمیشە سەرنجی مرۆڤ بۆ دروستبوونی یەکەم جاری هەموو زیندەوەرێك ڕادەکێشێت، تاکو سەرسامی و بەدوور زانینی زیندووبوونەوە و دروستبوونی دووهەم جاریان لە زەین و بیردا هەڵبگرێت و، دەفەرموێ: ﴿قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾!

جا ئەم پەیامەش بە ڕێنمایی ئەم ئایەتە پیرۆزەی قورئان، بە وردی سەرنجی تێڕامانی خوێنەر و گوێگر بۆ دەوروبەر ڕادەکێشێت و، چاوەکانی دڵ و ژیری و گیان و دەروونی ئەو بەسەر دیاردە هاوچەشن و نموونە هاووێنەکانی حەشری مەزندا دەکاتەوە. بە جۆرێك کە مرۆڤی خاوەن هەست و نەست و ڕێزگری ژیری و بیری هەستیار لەسەر مەساری "دڵنیایی ئیمان بە دواڕۆژدا" تا کۆتایی ژیانی و شادبوونی بە بەختەوەریی هەمیشەیی، ڕابگرن.

بەڵێ، ئەگەر کەسێك وتی:

"ئەم خانووەی تیایدا دانیشتووین، وەستایەك هەیە، دوای ڕووخاندن و تەختکردنی، سەرلەنوێ بنیاتی دەنێتەوە"..

لە کاتی بیستنی هەواڵێکی وادا، ئایا چ هەڵوێستێك بە کارێکی ژیرانە لە قەڵەم دەدرێت؟!

ئایا باوەڕهێنانی بێ لێکدانەوە؟ یان بەدرۆخستنەوەی هەڕەمەکی؟

خۆ ئەگەر کەمێك بوار بە بیرکردنەوەمان بدەین و، پرس و ڕای ژیری و مەنتیقمان پشتگوێ نەخەین، هیچ کام لەو دوو هەڵوێستە سەرپێیی و هەڵەشانە بە ڕەفتارێکی ژیرانە لە قەڵەم نادەین. چونکە مەنتیقی زانستییانە لێرەدا پرسیارێکی ڕەوا و زەق دەخاتە بەردەمی بابای هەواڵدەر و، پێی دەڵێت:

ئایا کێیە ئەو کەسەی کە دوای ڕووخانی ئەم خانووە، جارێکی تر سەرلەنوێ بنیاتی دەنێتەوە؟ ئایا وەستای بەننا و ئەندازیاری یەکەم جاریەتی؟

یاخود کەسێکی ترە کە هیچ پەیوەندی‌یەکی بە وەستا و بنیاتنەری یەکەم جاریەوە نی‌یە؟ کەسێکە هیچ سیفەت و کارامەییەکی ئەوی تێدا نی‌یە؟!

چونکە ئەگەر پێی وابێت کەسێکی دیکەی جگە لە بنیاتنەری یەکەم جاری ئەو خانووەیە کە سەرلەنوێ دروستی دەکاتەوە، ئەوا دەرگاکانی گومان و دوودڵی سەبارەت بە توانست و لێهاتنی ئەو کەسە دەخاتە سەرپشت و، ڕێ بۆ پرسیارێکی تری نوێ خۆش دەکات، کە ئایا:

چ بەڵگەیەك دەیچەسپێنێت ئەو کەسەی تۆ لێی دەدوێیت توانای ئەنجامدانی ئەم کارەی هەیە؟

واتە لە حاڵەتێکی وادا ڕێی تێدەچێت کە مرۆڤ دووچاری گومان بێت و، بیانووی بەدرۆخستنەوە و باوەڕنەهێنانیشی بۆ دەرەخسێت، چونکە وەڵامدانەوەی ئیجابیی پرسیاری وەك ئەمە هێندە دژوارە کە زۆر بە ئەستەم دەچەسپێت و قەناعەت بە دڵی مرۆڤ دەبەخشێت!

بەڵام گەر لە وەڵامدا وتی:

"هەر خودی بنیاتنەری یەکەم جاریەتی کە بۆ جاری دووهەمیش بنیاتی دەنێتەوە"..

ئایا ئیتر بە لای ژیریی بێگەردی مرۆڤەوە چ ڕێگرێك بۆ باوەڕهێنان هەیە؟ یان چ گومانێك لە ئاستی توانستی وەستای بەننادا پەیدا دەبێت؟!

خۆ ئەگەر – خوا نەخواستە – هێشتا لەم کاتەشدا بیری مرۆڤ لەکەی گومانی لێ بنیشێت، ئەوا هەر تەنها بە سەرنجدانێکی کەمی ئەو خانووەی تیایدا دانیشتووە، لە هەموو گەرد و خەوشێك خاوێن دەبێتەوە،چونکە هەر پرسیارێك لەم حاڵەتەدا سەر هەڵبدات، تەنها لە ڕووی "توانست و زانست و دانایی و لێهاتن"ی وەستای بنیاتنەر و ئەندازیاری خانووەکەوە دێتە گۆڕێ، خۆ ئاشکرایە کە تەنها بە سەرنجدان و وردبوونەوە لەو خانووەی تیایدایە وەڵامی گشت پرسیارەکانی مەیسەر دەبێت.

کەواتە فەرموو بۆ خۆت سەرنجی خانووەکە بدە.. لێی ورد بەرەوە.. ئەندازەی ژوورەکانی لێك بدەرەوە.. گۆشە و دووریەکانی بپێوە.. بەرز و نزمی و پانی و درێژیی دیوارەکانی هەڵبسەنگێنە... هتد..

وەك ئاشکرایە، دوای سەرنجدان و تاوتوێ کردن و هەڵسەنگاندنی ئەم چەشنە لایەنانە، ڕادەی توانست و زانست و دانایی و لێهاتنی وەستای یەکەم جارت بۆ دەردەکەوێت، کە لەو خانووەدا نموونەکانیان بەرجەستە بووە. جا ئایا هەموو ئەوانە نابن بە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا لەسەر توانستی بنیاتنەری دووهەم جاریش، کە هەر خودی ئەوەی یەکەم جارە؟ ئایا دوای ئەم ڕوونبوونەوەیە هێشتا بە ئەندێشەی کەسێکدا دێت کە بڵێت:

کوا ئەو کەسە؟ کێ لەو جیهانەوە هاتووەتەوە؟

دیارە گەر مرۆڤێك هێندەی تۆزقاڵێك خاوەنی هەست و نەست و ژیری بێت، نەك هەر وڕێنەی وەك ئەمەی لە زار دەرناچێت، بەڵکو وەهمی وەهایشی بە ئەندێشەدا تێپەڕ نابێت! چونکە دڵنیایە کە هەر خودی خۆی لەو جیهانەوە هاتووەتەوە! ئەوەتا ئەوەندە نموونەی بەرجەستەی کارەکانی ئەو جیهانەی ئەوێ، لێرەدا و لەم جیهانە بینراوەی بەرچاودا زەق بوونەتەوە، کە بواری لاوازترین گومانیشی بۆ ناهێڵنەوە.

هەر بە وێنەی ئەم نموونەیە، قورئانی پیرۆزیش زیندووبوونەوەی گیانلەبەران و، بنیاتنانەوەی سەرلەنوێی دووهەم جاری خانەکانی جەستەی یەك بە یەکیان، دەداتە پاڵ دروستکەر و بەدیهێنەر و بنیاتنەری یەکەم جاریان، نەك یەکێکی تر. واتە بەڵگەکانی زیندووبوونەوە و، توانست و زانست و دانایی و لێهاتنی بەدیهێنەر و بنیاتنەری دووهەم جار لە جیهانێکی تری دوور لەم جیهانەی خۆماندا نین، تاکو - گەر بە ڕاستمان بێت - چاوەڕوانی هاتنەوەی کەسێك بین لەو جیهانەوە بۆ ئەوەی ڕاستیی ئەو هەواڵەمان بۆ بچەسپێنێت!

نــەخێر.. ئێمــە خۆمــان ئــەو کەســەین.. گشــت بەڵگــە و نموونــە و ڕووداوەکانی ئەو جیهانەی ئەوێ، لـێرەدان.. لـەم جیهانـەی خۆمـاندان.. لـە پێش چاومـاندان (واتـە: لـە پێـش چـاوی سـەرمان، هـەروەك لـە پێـش چـاوی ژیرمـاندا)! ئەوەتا زایەڵەی ئایەتی پیرۆزی:

﴿قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ (يس: ٧٩)..

هەروەها ئایەتی:

﴿إِنَّ ذَلِكَ لَمُحْيِي الْمَوْتَى وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (الروم: ٥٠)..

لە خەوی ئەندێشە و بـێ ئاگـایی بەخەبەرمان دێنێـت.. پـەردەی ڕاهـاتن و ئولفەت گرتنمان بە دیاردەکـانی ژینگـە و ژیانمانـەوە لەبـەر چـاودا لادەدات.. چاومان پێ دەکاتەوە.. سەرنجی تێڕامانمـان لـە ڕواڵەتـەکانی دەوروبـەردا تێـدا دەهەژێنێت..

دەسا تۆش - برای مرۆڤم! - دەرگـای بـیر و مـەنتیق لـە هەسـت و ژیریـت دامەخە.. چاوەکانت واڵاکە.. سەرجەم دەرگا و پەنجەرەکانی گشت هەسـتە ئاشکرا و پەنهانەکانت سەرپشت بخە. با سروەی فێنکی دڵنیایی ئیمان بەسـەر ئەو هەستانەتدا هـەڵبکات و، هـەر بـۆ خـۆت بەڵگـە بـەهێز و چەسپێنەرەکانی ئیمان ببینیت کە لە هەموو لایەکەوە ئابڵۆقەی تۆیان داوە..

فەرموو بڕوانـە بـۆ نـاوازەیی سنعەت و، بەڵگـەکانی ویسـت و توانسـت و دانـایی لـە دروسـتکردن و پاشـان زیندووکردنـەوەی یـەك بە یـەکی: گـوڵ.. گەڵا.. تۆو.. درەخـت.. زینـدەوەر.. ئەندامـەکانی جەسـتەت، بـۆ نموونـە: چاوەکـانت.. پەنجـەکانت.. هەسـتەکانت.. دەمارەکـانت.. خڕۆکـەکانی خوێنت... هتد!

بە وردی و تێڕامانەوە سەرنجیان بدە.. بە ڕێبـازێکی ژیـری و زانستییانە لـە ناخیاندا ڕۆبچۆ. با بزانیت چ موعجیزات و ویسـت و توانسـت و داناییـەکی

سەرسووڕهێنەر لە هەموو یەکێکی ئەوانەدا بەرجەستە بوون. خۆ هیچ کام لەوانە هی جیهانێکی تر نین[1]!

جا بەدیهێنەرێکی دانا و زانا و خاوەن ویست و توانستی ئەوتۆ کە بۆ یەکەم جار ئاوا دروستی کردبن و، لە بەرچاوی هەست و ژیریی تۆدا بەم چەشنە سەرسووڕهێنەرە بەدیی هێنابن، چی هەیە ڕێ لەو توانستەی ئەو بگرێت کە جارێکی تر سەرلەنوێ بنیاتیان بنێتەوە؟ ئەو توانستەی کە لە هەموو بەهارێکی ئەم دنیایە و لە بەرچاوی خۆماندا نوێیان دەکاتەوە، چ دەستەڵاتێك دەتوانێت دەست بهێنێتە ڕێی و لە کاری ئەودا خۆی هەڵبقورتێنێت و نەهێڵێت لە دنیایەکی تردا جارێکی دی نوێیان بکاتەوە؟!

خۆ ئەگەر مرۆڤ خۆی نەخلافێنێت و چاوی نەنووقێنێت و هەست و ژیریی لەکار نەخات، بەپێی ڕێبازی ئەم چەشنە بیرکردنەوەیەی باسمان کرد، هەر لە ناوەندی دیاردەکانی ژیان لە دەوروبەری خۆیدا، هێندە بەڵگەی گومانبڕی حەشر دەبینێت کە دڵنیاییەکی لەسەدا سەدی پێ دەبەخشن. تەنانەت ئەو بەڵگە و دیاردانە هێندە سەرنجی دەبزوێنن کە لە ناخی خۆیدا زیندووبوون و بەدیهاتنی یەکەم جاری گەلێ بەلاوە سەیر و سەرسووڕهێنەرتر بێت تا دووهەم جار! چونکە هی یەکەم جاری لەبەر چاودایە.

ئنجا سروشتی بیر و ژیریی مرۆڤیش وەهایە کە بە (مشتێك) قایل دەبێت بیکات بە نموونەی (خەرمانێك). خۆ هەرکات بیر و تێڕامانی ئاراستەی ناخی ئەو دیاردانە بکات، نەك تەنها مشتێك بەڵکو دەیان وسەدان مشت نموونە و بەڵگەی "توانست و زانست و دانست"ی لە بەردەمدا زەق دەبنەوە کە بە تەواوی دووچاری سەرسامیی دەکەن..

---

(١) بۆ یارمەتیدانت لەم بیرکردنەوە باڵایەدا و مەشق کردنت لەسەر ئەم تێڕامانە ئیمانییە، سوود لە کتێبی: (الإنسان ومعجزة الحياة) وەربگرە.

لەبەر ئەوە، هەرگیز دروستبوونەوەی دووهەم جاریان بە کارێکی دوور و نەگونجاو نازانێت، چونکە هی یەکەم جاری بەوپەڕی وردی و شکۆداری لەبەرچاودایە، خۆ هەر بەدیهێنەری ئەم یەکەم جارەیە کە دووهەم جاریش بەدییان دەهێنێتەوە!

کەواتە ئێمە ئەگەر بە وردی و جیددی و لێبڕانەوە بڕوانینە ئەم کێشەیە، بۆمان دەردەکەوێت کە سەرتاپای خۆمان و دەوروبەرمان نوقمی موعجیزاتی توانستی یەکێکی دانای زانای بەتواناین.. سەدان هەزار نموونەی بەرجەستەی حەشر و زیندووبوونەوە دەبینین کە لە نێوانیاندا دەژیین. بگرە ئەم تێڕامانە زانستی‌یە مرۆڤ دەگەیەنێتە ئەو ئاستەی کە ژیانی یەکەم جاری گەلێ بەلاوە سەیر و سەرسووڕهێنەرتر بێت، لەچاو هی دووهەم!

واتە ئەم بیرکردنەوە ئیمانی و قورئانی‌یەی کە ئەم پەیامە بۆ خوێنەرەکەی فەراهەمی دەهێنێت، زیندووبوونەوەی ئەودنیا و حەشری قیامەت دەکات بە ڕاستی‌یەکی هێندە ڕوون و بەڵگەنەویست کە گەلێ لەچاو ڕاستیی ژیانی بەرچاوی ئەم دنیادا بێ گومانتر دەربکەوێت.

هەر لەبەر ئەم ئەنجامە بەنرخەی "ئیمان بە حەشر" بووە کە لەم پەیامەوە هەستی پێ کراوە، وا کەسانێکی زۆر هەبوون و هەن دەیان جار "پەیامی حەشر"یان خوێندووەتەوە و، هەموو خوێندنەوەیەکی نوێ - بێ هیچ بێزاربوونێك - چێژی تازە و پلەی ئیمانیی نوێ و بەرزتری پێ بەخشیون.

مامۆستا نوورسی لەبارەی کاریگەریی "پەیامی حەشر"ەوە نموونە بە خۆی و "عەبدوڕەحمان"ی برازای دەهێنێتەوە. ئەوەتا سەبارەت بە خۆی دەڵێت:

(ئەم پەیامە - وتەی دەهەم - هێشتا پلە و پایەی شایانی خۆی نەدراوەتێ. من هەر خۆم نزیکەی پەنجا جار خوێندوومەتەوە و، لە هەموو خوێندنەوەیەکدا

تامێکی نوێم چەشتووە و، هەستم کردووە کە پێویستم بە خوێندنەوەیەکی نوێی تر هەیە! کەچی هەندێ کەس پەیی بەم گرنگی‌یە نەبردووە و بە چاوی پەیامە زانستی‌یەکانی تر دەڕوانێتە ئەم چەشنە پەیامانە و، تەنها یەك جار دەیخوێنێتەوە و جارێکی تر بەسەری ناکاتەوە. لە ڕاستیدا ئەم پەیامە یەکێکە لەو زانستە ئیمانی‌یانەی کە پێویستیی مرۆڤ پێیان وەك خواردنی نان وایە، پێویستی‌یەکی ڕۆژانەیە و هەمیشە نوێ و دووپات دەبێتەوە.)[1].

سەبارەت بە "عەبدوڕەحمان"یش، کە هەشت ساڵ بوو لە یەکتری دابڕابوون و، لەو ماوەیەدا چڵك و لەکەی مەعنەویی "بێ ئاگایی" و، وەهم و گومانی "گومڕایی" دڵ و بیری ئەویان گرفتاری چەندین باری دەروونیی دژوار کردبوو، کاتێ کە "پەیامی حەشر"ی بەدەست دەگات و بە خوێندنەوەی بەهرەمەند دەبێت، بە تەواوی لەو چڵکە مەعنەوییانە خاوێن دەبێتەوە و، دەگاتە پلەیەکی هاووێنەی پلەی ئەولیاکان! ئەم بەسەرهاتەش سێ مانگ پێش ماڵئاوایی کردنی لەم ژیانەی دنیا ڕوو دەدات[2].

جگە لەم نموونانەش، یەکێك لە قوتابیانی مامۆستا نوورسی دەڵێت:

سی جار "پەیامی حەشر"م خوێندووەتەوە، هێشتا هەر حەزم لێیە چەندین جاری تریش بیخوێنمەوە و، پتر تامەزرۆیی و تینوێتیی ناخی دڵمی پێ بشکێنم[3].

تەنانەت یەکێك لە هاندەرانی وەرگێڕانی ئەم پەیامە بۆ زمانی کوردی هاوڕێیەکی دڵسۆزم بوو، کە هات بۆ سەردانم و، لێی پرسیم:

ئایا "پەیامی حەشر"ت کردووە بە کوردی؟

---

(١) بڕوانە: (پاشبەندەکان) لاپەڕە: ١٠٤.

(٢) بڕوانە: (نوورەکانی حەقیقەت) ل: ١٨٧، یان (مەکتووبات) ل: ٦٠١، هەروەها (پاشبەندەکان) ل: ٣٨-٤٠.

(٣)بڕوانە (ڕابەری خزمەتگوزارانی قورئان) ل: ١٣٦-١٣٧.

كە لە وەڵامیدا وتم:

مەگەر چەند برگە و باسێكی پچڕپچڕی ئەو پەیامە، دەنا بە تەواوەتی هەموویم وەرنەگێڕاوە..

سەری سووڕ ما و، وتی:

سەد حەیف كە پەیامێكی ئاوا بەنرخت لەبەر دەستدا بێت و، تا ئێستا بیرت لە وەرگێڕانی نەكردبێتەوە!

ئنجا وتی:

من بەش بە حاڵی خۆم "پازدە جار" خوێندوومەتەوە و، هێشتا هەست بە پێویستیی خوێندنەوەی دیكەی دەكەم!

ئێستاش دوای ئەم ڕوونكردنەوانەی كە پێش چاومان خستن سەبارەت بە ڕێبازی "پەیامەكانی نوور" لە باسكردنی بابەتەكانی ئیمان و، كاریگەریی "پەیامی حەشر" لە دامەزراندنی باوەڕی توندوتۆڵی لەق نەبووی ئیماندارانەوە بە مەسەلەی زیندووبوونەوە و حەشری ئەودنیای هەمیشەیی و، ڕێ خۆشكردن بۆ تێگەیشتن لە ناوەڕۆكی ئەم پەیامە.. خولكی خوێنەری بەڕێز بۆ خوێندنەوەی لەسەرخۆ و وردی خودی پەیامەكە دەكەین، تاكو ئەویش بۆ خۆی لەم دەرەنجامە دڵنیا ببێت و، بە پلەكانی دڵنیایی ئیماندا پتر سەربكەوێت و، پاشان لە نزای بێگەرد و دڵسۆزانەشی بێ بەشمان نەكات.

وصلى الله على سيدنا محمد إمام المرسلين وعلى آله وصحبه أجمعين.

وآخر دعوانا: ﴿أنِ **الحمد لله رب العالمين**﴾.

*فاروق ڕەسووڵ یەحیا*

# وتەی دەهەم

## (باسی حەشر)

ڕوونکردنەوەیەك:

هۆی نموونە هێنانەوەم بە شێوەی چیرۆك لەم پەیامانەدا ئەوەیە کە واتاکان لە مێشك و زەینەکانەوە نزیك بخرێنەوە و.. لە لایەکی تریشەوە دەربکەوێت کە "ڕاستی‌یەکانی ئیسلام" چەندە لەگەڵ ژیریی مرۆڤدا تەبا و شیاو و گونجاون و، چەندەش پتەو و توندوتۆڵ و ڕەگداکوتاون. واتە ئامانج و کاکڵەی چیرۆکەکان ئەو ڕاستی‌یانەن کە لە ئەنجامدا دەیاندەن بە دەستەوە و بەڵگەکانی دەدرکێنن. کەواتە ئەم چیرۆکانە ئەندێشەیی نین، بەڵکو تێکڕا ڕاستیی گومان لێ نەکراون.

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿فانظُرْ إلى آثارِ رَحْمَتِ اللهِ كيفَ يُحي الأَرضَ بعد موتِها إِنَّ ذلك لمحي الموتى وهو على كلّ شيءٍ قدير﴾ (الروم:٥٠)

برادەر!

ئەگەر دەتەوێت ڕاستیی "حەشر" و هەندێ کاروباری سەر بە دوارۆژت لە ئاستی حاڵی بوونی گشتیی خەڵکیدا بۆ ڕوون ببێتەوە، ئەوا فەرموو لەگەڵ مندا گوێ لەم کورتە چیرۆکە ڕابگرە:

لە گەشتێکدا دوو کەس پێکەوە بۆ وڵاتێکی گەلێ قەشەنگ و تابلۆیی جوان و ڕەنگینی وەك بەهەشت ڕۆشتن (مەبەست لەم تەشبیهە دنیایە) کە گەیشتنە ئەوێ، سەرنجیان دا خەڵکی ئەو وڵاتە دەرگای دوکان و خانووەکانیان بە کراوەیی جێ هێشتووە و، بایەخ بە چاودێری و پاراستنی خانووبەرە و دوکانەکانیان نادەن و، پارە و پوول و سامانەکانیان بێ هیچ پاسەوانێك و بە ئاشکرا و لەبەر چاو و دەستی خەڵکیدا داناوە!

کە ئەمەیان دی، یەکێکیان - بە هاندانی دەروونی بەدخوازی خۆی - ئەمەی بە هەل زانی و، پەلاماری ئەو کەرەسە و شمەك و پارە و سامانانەی ئەوێی دا و، تاوێ تاڵانی دەکردن و تاوێکی تر چیی بەردەست بکەوتایە بە دزی دەیبردن.. بەم جۆرە، هەر چەشنە ستەم و خراپکاری‌یەکی پێ کرا و لێی وەشایەوە درێغیی لێ نەکرد و، دانیشتووانی وڵاتیش بایەخێکی ئەوتۆیان پێ نەدەدا!

هاوڕێکەی پێی وت:

- (ئەوە چی دەکەیت؟.. بێ گومان تۆ هەر ئاوا ئەم کارانەت بەسەردا تێناپەڕێت و لە ئەنجامدا سزای ئەم ڕەفتارانەت دەچێژیت و، منیش - لەگەڵ خۆتدا - دووچاری چەندین بەڵا و گیروگرفت دەکەیت. ئەم سامانانەی دەیانبینیت، هی دەوڵەتن و، دانیشتووانی وڵاتیش بە خاوخێزانەوە تێکڕا بوون بە سەرباز و کارمەندی دەوڵەت و، بە پۆشاکی میللی(مەدەنی)یەوە لە کار و فەرمانبەری‌یەکانیاندا خراونەتە کار، هەر لەبەر ئەوەشە کە بایەخێکی ئەوتۆیان پێ نەدایت. ئنجا ئەوەش بزانە کە یاسا و ڕێسای ئێرە گەلێ توند و تیژە و، لە هەموو لایەکدا تەلەفۆن و چاودێر و هەواڵدەر و پیاوانی پادشا بڵاو بوونەتەوە. دەسا هەر ئێستا خێراکە و بە پەلە برۆ داوای لێبوردن بکە).

بەڵام هاوڕێ گێژ و گەلحۆکەی، ئینکاری و سەرسەختیی نواند و، وتی:

- (ئەم سامانانەی دەیانبینیت هەرگیز هی دەوڵەت نین، بەڵكو بێ خاوەن و گشتی و هەرەمەكین و، هەموو كەسێك دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی دەستیان بۆ ببات. ئەوەتا من هیچ شتێك نابینم رێی سوود وەرگرتنم لەم شتە جوان و رەنگینانەی بەردەمم لێ بگرێت. ئەوەش بزانە كە جگە لە شتێ بە چاو ببینم باوەرم بە هیچی تر نییە)! پاشان كەوتە قسەی پروپووچی ورێنەئاسا و فەلسەفە لێدانی ئەم بۆچوونەی خۆی!

ئا لێرەدا گفتوگۆكەی نێوانیان پتر پەرەی سەند و كەوتە دۆخێكی توند و گەرمەوە و، بابای گێلی گەلحۆ لە هاوەڵەكەی زیاتر هاتەپێش و، لێی پرسی:

- (ئایا پێم نالێیت پادشا كێیە؟.. من نایناسم)!

هاورێكەی وەڵامی دایەوە:

- (تۆ گومانت لەو راستییەدا نییە كە: گوندی بێ كوێخا و.. دەرزیی بێ وەستا و خاوەن و.. پیتی بێ نووسەر نییە و نابێت. ئەی ئایا چۆن ئەوە بە خۆت رەوا دەبینیت كە پێت وابێت ئەم وڵاتە رێكوپێك و رەنگینە بێ پادشا و فەرمانرەوا بێت؟ یان چۆن ئەم هەموو سەروەت و سامانە بەنرخ و بەهادارانە بێ خاوەن دەبن؟ كە ئەوەندە زۆر و زەبەندە و بەردەوامن دەڵێی لە جیهانی پەنهانی غەیبەوە شەمەندەفەرێكی پڕ لە ئازووقە و رۆزیی بەنرخ دەم بە دەم دێت و بارەكەی لێرەدا رۆ دەكات و پاشان دەگەرێتەوە و دەروات[1]؟ ئایا نابینیت لە هەموو لایەكی ئەم وڵاتەدا ئاگاداری و بەیاننامەكانی پادشا بڵاوكراونەتەوە و، ئاڵاكانی لە هەموو گۆشەیەكدا دەشەكێنەوە و، تەمغە و مۆری تایبەتیی خۆی لەسەر ئەو هەموو كاڵا و سەروەت و سامانانە نەخشێنراوە؟ ئیتر چۆن بە بێ خاوەنیان دادەنێیت؟.. دیارە تۆ شتێك لە زمانی فەرەنگ فێربوویت و توانای خوێندنەوەی ئەم نووسینە ئیسلامییانەت

(١) ئاماژەیە بۆ وەرزەكانی ساڵ، ئەوەتا وەرزی "بەهار" وەك شەمەندەفەرێك وایە كە لە جیهانی پەنهانی غەیبەوە هاتبێت و، بە پڕی خواردەمەنی و ئازووقەی لێ باركرابێت. (دانەر)

نەماوە و، ناتەوێ لە کەسێکی شارەزاش بپرسیت و داوا بکەیت ئەو نووسینانەت بۆ بخوێنێتەوە! وەرە با من گرنگترینی ئەو فەرمان و بەیاننامانەی پادشات بۆ بخوێنمەوە).

هاوڕێ سەرسەختەکەی گەڕایەوە و وتی:

- (با دان بە بوونی پادشایشدا بنێین.. بەڵام ئایا چ زیانێکی پێ دەگات و چ کەموکووڕی و ناتەواوی‌یەك بە گەنجینەکانیەوە دەردەکەوێت گەر من بۆ خۆم سوودێکی ئاوا کەمیان لێ ببینم؟.. پاشان من لێرەدا هیچ بەندیخانە و تۆڵە و سزایەکی هاوچەشنی نابینم کە تۆ باسیان دەکەیت)!

هاوڕێکەی وەڵامی دایەوە:

- (برام! ئەم وڵاتەی بەرچاومان - لە ڕاستیدا - بریتی‌یە لە:

گۆڕەپانێکی تاقیکردنەوە و..

مەیدانێکی مەشق و مانۆڕ و..

پیشانگایەك بۆ خستنەڕووی سنعەتە نایابەکانی پادشا و..

میوانخانەیەکی تابلێی کاتی و کەم خایەن.

ئایا نابینیت هەموو ڕۆژێ کاروانێك میوان دێنە ناوی و کاروانێکی تر دەڕۆن و کۆچ دەکەن و، هەمیشە لە میوان پڕ دەکرێت و پاشان خاڵی دەکرێتەوە؟ جا ئەم مەیدانە - لە ئەنجامدا - بە تەواوی و یەکجاری لە میوانەکانی ناوی چۆڵ دەکرێت و دەگۆڕێت بە مەیدانێکی تری نوێی هەمیشەیی و، ئنجا هەموو خەڵکی بۆ ئەوێ دەبرێن و، هەریەکەیان "سزا" یان "پاداشت"ی خۆی لەوێ وەردەگرێت).

هاوڕێ خیانەتکار و سەر لێ شێواوەکەی، جارێکی تر لێی هەڵگەڕایەوە و وتی:

- (باوەڕم بەم قسانەت نی‌یە! چۆن دەگونجێ ئەم وڵاتە ئاوەدانە لەناو ببرێت و دانیشتووانیشی بۆ وڵاتێکی تر بڕۆن و بگوێزرێنەوە)؟

هاوڕێ ئامۆژگار و بێ وەی و دڵسۆزەکەی پێی وت:

- (مادەم تۆ ئاوا سەرپێچی لە "ڕاستی" دەکەیت و لەسەر بۆچوونی خۆت هەر سوور و بەردەوامیت، ئەوا وەرە با بە کورتی و لە نێوان "دوازدە وێنە"دا ئەوەندە بەڵگەی لەژمارە بەدەرت بۆ ڕوون بکەمەوە کە هەر هەموویان - بە بێ گومانی- بوونی دادگایەکی یەکجار مەزن و.. خانەیەکی پاداشتدانەوە و.. لانەیەکی تۆڵە و بەندی و سزات بۆ دەچەسپێنن و، دەری دەخەن کە هەروەك ڕۆژ لە دوای ڕۆژ وڵات لە دانیشتووانی خاڵی دەکرێتەوە، هەر بەو جۆرەش ڕۆژێك دێت کە بە یەکجارەکی ئەم خاکەیان لێ چۆڵ دەکرێت و ئەم وڵاتەش بە تەواوی وێران دەبێت).

❑ وێنەی یەکەم:

ئایا دەگونجێ وڵاتێکی خاوەن پادشا - بە تایبەت پادشانشینێکی مەزنی وەك ئەمە - پاداشتی بۆ گوێڕایەڵان و تۆڵە و سزایشی بۆ یاخی بووان تێدا نەبێت؟

خۆ مادەم ئەم سزا و پاداشتە لەم خانەیەدا لە حوکمی "نەبوو"دایە، ئەوا بێ گومان دەبێ دادگایەکی تەواو مەزن لە خانەیەکی تردا هەبێت تاکو ئەو تۆڵە و پاداشتانە دەستنیشان بکات!

❑ وێنەی دووەم:

سەرنج لە ڕەوتی ڕووداوەکان و بەڕێوەبردنی کاروباری ناو وڵات بدە و بزانە چۆن ڕزق و ڕۆزیی زۆر و بەلێشاو بەسەر هەموو بوونەوەرێکدا، تەنانەت بەسەر هەژارترین و لاوازترینیاندا دابەش دەکرێت و.. بۆ گشت بیمارێکی بێ کەس و بێ نەوا بڕوانە و ببینە کە چۆن چاودێریی تەواوەتی و دڵنەوایی بەردەوامیان بۆ فەراهەم هێنراوە و.. سەیری ئەو خواردەمەنییە نایاب و، دەفرە ڕەنگین و، مەدالیا قەشەنگ و، پۆشاکە نەخشاوانە بکە و..

تەماشاکە: سفرە و خوانی پڕ لەو خواردەمەنی‌یە بەتام و چێژ و نایابانە لە هەموو شوێنێکدا ڕاخراون..

ئنجا بڕوانە: هەموو یەکێ لەو خەڵکە، کاری سەرشان و ئەرکی ئەستۆیان زۆر بە ڕێکوپێکی ئەنجام دەدەن و، جگە لە گێل و بێ ئاگایانی چەشنی تۆ، دەنا کەسیان بە ئەندازەی سەرە پەنجەیەکیش لە سنووری خۆیان لانادەن. چونکە مەزنترین کەس بەوپەڕی لەخۆبوردەیی و ڕێز و نەوازش و، لەوپەڕی گوێڕایەڵی و ملکەچیدا و، لە سایەی سام و شکۆی ئەو پادشاییەدا، ئەرکی سەرشانی خۆی ڕادەپەڕێنێت. کەواتە خاوەن و پادشای ئەم وڵاتە، دارای:

"کەرەم"ێکی مەزن و..

"میهرەبانی"یەکی فراوان و..

"عیززەت"ێکی بڵند و..

"غیرەت"ێکی شکۆداری ئاشکرا و..

"شەرەفمەندی"یەکی تابڵێی بەرز و باڵایە!

خۆ ئاشکرایشە:

"کەرەم" داخوازی: "نیعمەت بەخشین"ە و..

"میهرەبانی"ش بە بێ: "چاکەکاری" نایەتەدی و..

"عیززەت"یش داوای بوونی: "غیرەت" دەکات و..

"شەرەفمەندی"ی بەرز و باڵایش داواکاری: تەمێکردنی هەموو ئەو کەسانەیە کە بە چاوی سووکەوە سەیری ئەم کارە مەزنانە دەکەن و بە گاڵتەجاڕی و، هەڕەمەکی و، بێ مەبەستیان دادەنێن.

کەچی - لەگەڵ ئەمەشدا - کە بە وردی سەرنج دەدەین، دەبینین بەشێکی کەمی یەك لە هەزاری ئەو شتانەی کە شایستەی ئەو "میهرەبانی" و داخوازی ئەو "شەرەفمەندی"یەن، لەم وڵاتەدا نایەنەدی، ئەوەتا بابای

ملهوڕی ستەمكار بە لووت بەرزی و زەبر و زەنگەوە بێرەدا دەگوزەرێت و دەڕوات و، كاكی ستەم لێكراویش بە زەلیلی و لارەملی و شان كزی و دڵشكاوی، ملی ڕێ دەگرێتەبەر و لەم وڵاتە كۆچ دەكات!

كەواتە - بێ هیچ گومانێك - كێشەی ئەمانە، بۆ دادگایەكی گەلێ مەزنتر هەڵگیراوە و دواخراوە.

❑ وێنەی سێهەم:

سەیر بكە و بزانە كە: چۆن هەرچی كار و فرمانی ناو ئەم وڵاتە هەن، تێكڕا بە "دانایی"یەكی لە ڕادەبەدەر و.. "ڕێسا"یەكی ناوازە، ئەنجام دەدرێن..

ئنجا سەرنج بدە كە چۆن لە ڕوانگەی:

"دادگەری"ی ڕاستەقینە و.. بە: "تەرازوو"ی سەرنەكەری هەستیار، سەیری مامەڵە و ڕەفتارەكانی كەسانی ناو وڵات دەكرێت.

دیارە "دانایی" و ژیریی حكوومەت لەوەدایە كە چاوپۆشی و نەرمونیانی و ڕێزی زۆر لەگەڵ ئەو كەسانەدا بنوێنێت كە هانای بۆ دەبەن و.. ئنجا "دادگەری"یە خاوێن و بێگەردەكەشی داخوازی پاراستن و چاودێری كردنی گشت مافەكانی هاووڵاتیانیەتی، تاكو سام و شكۆی حكوومەت ڕاگیر بكرێت و، مەزنی و پایەداریی دەوڵەتیش بپارێزرێت..

كەچی لەو شتانەی كە شایستەی ئەو "دانایی" و داخوازی ئەو "دادگەری"یەن، بەشێكی یەكجار كەم نەبێ، هیچی‌تر دەرناكەوێت لێرەدا جێبەجێ بكرێت، ئەوەتا بێئاگایانی چەشنی تۆ بێرەدا گوزەر دەكەن و ئەم وڵاتە بەجێ دەهێڵن، بێ ئەوەی زۆربەیان سزای ڕەفتارە چەواشەكانیان بچێژن!

كەواتە یەكلایی كردنەوەی ئەم چەشنە كێشانە، بۆ دادگایەكی گەلێ مەزنتر دواخراوە.

❑ وێنەی چوارەم:

سەیری ئەو گەوهەرە بێ وێنە و نایابانە بکە کە لەم پیشانگایانەدا پێش‌چاو خراون..

بۆ ئەو خواردەمەنی‌یە خۆش و بەتام و ناوازانە بڕوانە کە ئەم هەموو سفرە و خوانانەیان پێ ڕازێنراوەتەوە!

ئەمانە، دەری دەخەن کە: پادشای ئەم وڵاتە دارای "سەخاوەت"ێکی بێ سنوور و.. "گەنجینە"یەکی پڕاوپڕی بێ کۆتایی و نەبڕاوەیە.

خۆ ئەم چەشنە سەخاوەتمەندی‌یە بەردەوام و گەنجینە نەبڕاوانەش - بێ هیچ گومانێك - داخوازی بوونی: میوانخانەیەکی نەمر و هەمیشەیی ئەوتۆن کە هەرچی حەز و خواست و ئارەزووی دەروونی مرۆڤە، لەسەر سفرە و خوانەکانی ئەوێدا ئامادە کرابن و بۆ مرۆڤ دانرابن..

هەروەها داخوازی ئەوەشن کە: هەموو ئەو میوانانەی نیعمەتی پادشایان پێ دەبەخشرێت و تامی نیعمەت و بەخششەکانی ئەو دەچێژن، ئەوانیش - بە هەمان شێوە - هەمیشەیی و هەتاهەتایی بن و ئازاری جودایی و لێکبڕانیان دەرخوارد نەدرێت، چونکە هەروەك "نەمانی ئازار" لە خۆیدا تام و لەزەتێکی سەربەخۆیە، "نەمانی تام و چێژە خۆشەکان"یش - بە هەمان پێوەر - ئازارێکی یەکجار بەسۆ دەرخواردی ناخی مرۆڤ دەدات!

ئنجا سەیری ئەم پیشانگایانە بکە و.. سەرنج لەو بڵاوکراوە و ڕاگەیاندنانە بدە و.. گوێ لەو "بانگەوازکارانە" ڕابگرە کە لە بارەی لایەنە سەرسووڕهێنەرەکانی دروستکراوانی پادشای خاوەن موعجیزاتەوە دەدوێن و وەسفی یەك بە یەکیان پێش‌چاو دەخەن و "کەماڵ"ی پادشا و "جوانی"یە مەعنەوی‌یە بێ وێنە و ناوازەکەی ئاشکرا دەکەن و، سەرگەرمی باس و لێدوانی لایەنە ورد و ناسك و ڕەنگینەکانی جوانیی پەنهانی ئەون.

كەواتە ئەم پادشایە دارای "كـەماڵ"ێكـی ڕوون و "جوانـی"یـەكی گەشی مەعنەویی ئەوتۆیە كە هەستی سەرسووڕمان لای سەرنجدەرانیان بورووژێنن!

ئنجا گومانیش لەوەدا نی‌یە كە ئەو "كـەماڵ"ە پەنهانـە بـێ خـەوش و دوور لە ناتەواوی‌یەی پادشا، داخوازی ئەوەیە كە: لـە بـەرچاوی بینـەرە ڕێزلێگـر و سەرسـووڕماوە نـرخ زانـەكانیدا ئاشـكرا بكرێـت و پێش‌چـاو بخرێـت.. "جوانی"یە نادیار و بێ وێنە و ناوازەكەشی داواكاری ئەوەیە كە ببینرێت و لـە بـەرچاواندا دەربكـەوێت. واتـە داخـوازی ئەوەیـە كـە لـە دوو ڕووەوە "جوانی"یەكەی ببینرێت:

یەكەمیان: هەر پادشا بۆخۆی جوانی‌یەكـەی خـۆی لـە چـەندەها ئاوێنـەی جوانی دەرەوەی جۆراوجۆردا ببینێتەوە.

دووهەمیان: بینینی ئەو جوانی‌یەی خۆی بـە چاوی ئەوانـەی كـە بـۆ سـەیر كردنی ئەم پیشانگایە هاتوون و، تەماشاكەرانی تاسەمەند و كەسانی موشتاقی ئەو جوانی‌یەن!

ئەمەش ئـەوە دەگەیـەنێت كـە: ئـەو "جوانی‌یـە هەمیشـەیی"یـە داواكـاری: بینین و ئاشكرابوونە و، دەشیەوێت بە هەمیشەیی ببینرێت و خۆیشی ببینێـت. دیـارە ئەمـەش - بێ گومـان - داخـوازی: "هەمیشـەیی" و "هەتاهـەتایی"ی كەسانی بینەری تاسەمەند و ڕێز لێگر و نرخ شناسانی ئەو جوانی‌یەیە، چونكە "جوانیی هەمیشەیی و نەمر" بە موشتاق و تاسەمەندی لەناوچووی فـانی ڕازی نابێت!

ئنجا لەبەر ئەوەی كەسێ كە بڕیاری نەمانی لەسەر دەركرابێت، هەر تەنها بیركردنەوەی لـەو نەمانەی كە لـە ڕێیدایـە، "خۆشەویستی"یەكـەی نـاو دڵـی دەگۆڕێت بـە "دوژمنایـەتی" و، سەرسـووڕمانەكەشی بـە: "سـووك سـەیر كردن" و، "نرخ شناسی"یەكەشی بە: "ڕێز لـێ نەگرتن"، چونكە مـرۆڤ - بـە

سروشت - گەر شتێك نەزانێت و پەیی پێ نەبات، ئەوا دوژمنایەتیی دەکات و لە نرخی دادەگرێت..

جا لەبەر ئەمە و، مادەم هەموو ئەو کەسانەش کە دێنە ئەم پیشانگا و میوانخانەیە، خێرا و بە پەلە و بێ ئەوەی لە نووری ئەو "جوانی" و "کەماڵ"ە تێر بن و تاسە و تینوێتی‌یان لێی بشکێت، دەڕۆن و بەجێی دەهێڵن، بگرە لە ماوەی چەند چرکەیەکدا چەند سێبەرێکی کەمی کز نەبێت هیچی‌تریان لێ نابینن، ئەوا - بێ هیچ گومانێك - کۆچی ئەو گەشتیارانە بەرەو دیمەنگایەکی نەمری هەتاهەتایی وەهایە کە لەوێدا بە هەمیشەیی و کامی دڵ، شاد و بەهرەمەندی ئاواتەکانیان دەبن!

☐ وێنەی پێنجەم:

سەرنج بدە و بزانە کە:

چۆن ئەم پادشا (ناوازەیە) دارای "میهرەبانی"یەکی ئەوەندە مەزنە کە لە گەرمەی ئەم هەموو کار و ڕووداوانەدا ئەو "میهرەبانی"یەی دەردەکەوێت. ئەوەتا فریای هانا بۆبەرانی دەکەوێت و، بەدەم پەنا بۆهێنەرانیەوە دەڕوات و، بچووکترین پێداویستیی ئاسایی‌ترین کەسی وڵاتەکەی - بەوپەڕی سۆز و میهرەوە - جێبەجێ دەکات. ئەمەش لە ڕادەیەکی وەهادایە کە تەنها بۆ فریاگوزاریی زامی قاچی یەك سەر "مەڕ"ی شوانێك مەڵهەم و دەرمان و بەیتاڵی پێویست پەیتا پەیتا ئامادە دەکات.

وەرە - ئەی هاوڕێکەم! - با پێکەوە بۆ ئەو دوورگەیە بڕۆین کە حەشاماتێکی زۆری تێدا جەم بووە و، گشت کەسانی بەڕێز و پایەداری وڵاتی تێدا کۆبوونەتەوە..

بڕوانە! ئا ئەوە نوێنەرێکی بەڕێزی پادشایە هاتووە و مەزنترین مەدالیای خەڵاتکراوی پۆشیوە و، لەناو ئەو خەڵکەدا وتار دەدات و، داوای چەند شتێك لە پادشای بەسۆز و میهرەبانی دەکات و، ئنجا ئەو حەشاماتەش لەو

داواكاری‌یانەیدا پشتی دەگرن و هەمان خواست و ویست لە پادشایان دەخوازن.

فەرموو گوێ لە وتەكانی ئەو نوێنەرە خۆشەویستەی پادشای مەزن رابگرە، ئەوەتا بە ئەدەبێكی گەلێ زۆر و لالانەوەیەكی یەكجار بەكوڵەوە دەپارێتەوە و دەڵێت:

- (ئەی پادشای ئێمە! ئەی ئەو كەسەی نیعمەتە رواڵەتی و پەنهانەكانی خۆی بەسەردا پەخشاندووین! ئێمە لە پایەی مەزنی و شكۆداریی پادشاییت داواكارین كە: هەروەك ئەو نموونە و سێبەرانەت لەم پیشانگایەدا پێش‌چاو خستین، سەرچاوە و بناغەكانیشیانمان لە شوێنی خۆیاندا پیشان بدەیت.. بمانبە بۆ بارەگا و مەڵبەندی پادشایی خۆت و لەم دەشتاییە وشك و برنگەدا لەناومان مەبە.. لە دیوان و مەڵبەندی حوزووری خۆتدا وەرمان بگرە و بەزەییت پێماندا بێتەوە.. لەوێ ئەو تام و لەزەتانەمان دەرخوارد بدە كە لێرەدا تامی نموونەكانیانت پێ چەشتین.. بە ئازاری دەركراوی و دووری لە خۆتەوە، سزامان مەدە.. ئەوەتا هەموو ئەوانە گەل و هاوولاتییانی تاسەمەند و سوپاسگوزار و گوێڕایەڵی تۆن، دەسا بێ خاوەن و سەرگەردانیان مەكە و، بە مردنێك كە گەڕانەوە و زیندووبوونەوەی لە دوا نەبێت، مەیان فەوتێنە).

ئایا گوێت لێ بوو - ئەی هاوڕێكەم! - ئەو نوێنەرەی پادشا بە ناوی ئەو حەشاماتەوە چیی وت و چ داواكاری‌یەكی پێشكەشی پادشا كرد؟

باشە ئایا دەگونجێ پادشایەك ئەم هەموو "توانا" لەڕادەبەدەر و "میهرەبانی"یە هەمەلایەنگیرەی هەبێت، داخوازی‌یەكانی ئەو نوێنەرە بەڕێزەی خۆی نەبەخشێت و، بە هانای مەزنترین و بەرزترین ئامانج و مەبەستەكانیەوە نەڕوات و نەیهێنێتەدی؟ لە كاتێكدا كە - هەر ئەم پادشایە - بەوپەڕی بایەخ پێدانەوە نزمترین ئارەزووی بچووكترین كەسی ناو ولاتەكەی جێبەجێ دەكات؟ لەگەڵ ئەوەشدا ئەنجامدانی داواكاری‌یەكانی ئەو نوێنەرە بەڕێزەی،

گشت ئاوات و ئامانجەکانی هەموانی پێ دێنەدی و، ئنجا "دادگەری" و "میهرەبانی" و "ڕەزامەندی"ی خۆیشی داخوازی هێنانەدیی ئەو داواکاری‌یانەن.. پاشان ئەو داخوازی‌یانە بۆ توانستی پادشا گەلێ ئاسانن و هەرگیز لەو نموونانە قورس و گرانتر نین کە لە باخچە و پیشانگاکانی ئەم وڵاتەدا پێش‌چاوی خستوون؟

جا مادەم ئەو هەموو خەرجی‌یە زۆر و زەبەندانەی لە دروستکردنی ئەم وڵاتەدا و بۆ مەبەستی پیشاندانێکی کاتیی نموونەکانی سنعەتی خۆی سەرف کردووە، ئەوا بێ هیچ گومانێك، لە مەڵبەندی پادشایەتیی خۆیدا لە گەنجینە ڕاستەقینەکانی خۆی و لایەنە سەرسووڕهێنەرەکانی ئەو سنعەتانەی، شتانی وا دەخاتە پێش‌چاوی بینەران کە ژیریی مرۆڤ سەرسام بکەن.

کەواتە، ئەو کەسانەی ئێستا وان لەم تاقیکردنەوەیەدا، بە هەڕەمەکی و بێ مەبەست نەهێنراونەتە ئێرە، بەڵکو ئەوانە یان کۆشکەکانی بەختەوەریی هەمیشەیی چاوەڕوانیانە.. یان بەندیخانە سامناکە هەتاهەتاییەکان!

❑ وێنەی شەشەم:

وەرە بۆ ئەم شەمەندەفەرە مەزن و، فڕۆکە پڕاوپڕ و، گەنجینە و عەمبارە گەورە لێوان و، پیشانگا قەشەنگ و سەرنج ڕاکێشانە بڕوانە..

بیر لە بەڕێوەبردن و ڕەوتی کاروبارەکان بکەرەوە!

ئەوەتا هەموو ئەمانە دەری دەخەن کە لە ڕاستیدا دەستەڵاتداری و پادشایەکی مەزن هەیە[1] لە پشتی پەردەوە حوکمڕانیی خۆی دەکات.

---

(١) هەروەك چۆن لەم سەردەمەداسوپای مەزن لە گۆڕەپانی مانۆڕ و کاتی دەست دانە جەنگدا، هەر تەنها بە وەرگرتنی فەرمانی: "چەکەکانتان هەڵبگرن.. نێزەکانیان لەسەر قایم بکەن" وەك دارستانێکی چڕی دڕکاویی لێ دێت.. هەروەها وەك لە هەموو جەژن و نمایشێکی سەربازیدا سەرجەمی سەربازگە تەنها بە وەرگرتنی فەرمانی: "نیشانەکانتان بپۆشن و مەدالیاکانتان بە بەرۆکدا بکەن" تێکڕا وەك باخچەیەکی جوانی پڕ لە گوڵزاری ڕەنگین دەخەملێت.. هەروەك ئەمانە وان، ڕووەکە بێ هەستەکانیش کە - چەشنی مەلائیکەت و جیننی و مرۆڤ - جۆرێکی

جا پادشایی و دەسەڵاتداریی ئاوا مەزن - بێ هیچ گومانێ - داخوازی ئەوەیە كە خاوەنی میللەت و ڕەعیەتی شایانی خۆی بێت. بەڵام ئەوەی كە بە چاو دەبینرێت هێشتا شایانی ئەو پادشایی و فەرمانڕەواییە نییە، چونكە ئەوەتا ئەو میللەت و ڕەعیەتانە لەم "میوانخانە"یەدا - واتە میوانخانەی دنیا - كۆبوونەتەوە، كەچی بێ ئەوەی ئەوان بحەوێنەوە، ئەم میوانخانەیە هەموو ڕۆژێك چەند دەستەیەك میوان بەڕێ دەكات و لە پێشوازیی چەند دەستەیەكی تری نوێدایە!

هەروەها ئەوان ئێستا لەم "گۆڕەپانی تاقیكردنەوە"یەدا ئامادە بوون، بەڵام هەموو سەعاتێك ئەم گۆڕەپانەش ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێت..

---

نەبراوە و بێ كۆتایی سەربازەكانی خوای گەورەن، هەر كە لە كاتی جیهاد و تێكۆشانیاندا بۆ پاراستنی ژیانیان فەرمانی: "كن فیكون"یان پێدەگات و بەجێهێنانی ئەم فەرمانەی خوای گەورەیان دەخرێتە ئەستۆ كە: "بۆبەرگری كردن لە خۆتان چەك و تفاقتان هەڵبگرن" ئەوا گشت درەختە مەزن و دەوەنە دڕكاوییەكان ڕمەكانیان ئامادە دەكەن و، سەرانسەری گۆی زەویش وەك سەربازگەیەكی یەكجار فراوان و مەزنی لێ دێت كە سەربازەكانی بە چەكی دەستی پڕچەك كرابن. ئەوەتا هەموو ڕۆژ و حەفتەیەكی بەهار وەك جەژنی دەستە و كۆمەڵێكی ڕووەك وایە و، هەموو تیرەیەكی ڕووەكەكانیش - وەك نمایشی سەربازی - ئەو دیارییە بەنرخ و مەدالیا قەشەنگ و ڕازاوانە لە بەرچاوی پادشای ئەزەلی و مەلائیكەتانی بینەر و شایەتیدەریدا دەپۆشن كە پادشایان پێی بەخشیون. وەك بڵێی فەرمانێكیان لە لایەن پەروەردگاریانەوە بەگوێدا درابێت كە: "نەخش و نیگارە ڕازاوەكانی سنعەتی پەروەردگار و، مەدالیا قەشەنگەكانی سرووشتی خوایی - كە گوڵ و بەروبوومەكانن - بپۆشن و با گوڵەكانتان دەمیان بپشكوێت" ئیتر هەر بە بیستنی ئەم فەرمانە، سەرانسەری گۆی زەوی وەك سەربازگەیەكی مەزنی لێ دێت لە جەژنێكی ڕازاوەی خۆشدا و، چەشنی نمایشێكی سەربازی لە بەرچاودا خۆی دەنوێنێت، كە نیشانە و مەدالیا ڕەنگینەكانی تێدا بریسكێنەوە.

جا ئەم گشت پڕچەك كردنەی ڕووەك، كە تا ئەم ئەندازەیە بە دانایی و ڕێكی ئەنجام دەدرێت و.. ئەم ئارایشتدانەی كە لە ڕادەی ناوازەییدایە.. بۆ هەموو خاوەن چاوێكی بینەری دەردەخەن كە تێكڕا فەرمانی پادشا و حوكمڕانێكی بەتوانای وەها جێبەجێ دەكەن كە توانستی ئەو كۆتایی نییە و، دانستیشی بێ سنوورە. ( دانەر )

هەروەها میوانەکان ماوەیەکی کەم لەم "پیشانگا" مەزنەدا دەمێننەوە و سەیری نموونەکانی نیعمەتە بەنرخەکانی پادشا و لایەنە سەرسوورهێن و ناوازەکانی سنعەتی نایابی ئەو دەکەن، کەچی پیشانگاکەش هەموو خولەکێك دەگۆڕێت و، ئەوەی دەڕوات نایەتەوە و، ئەوەش تازە دێتە ناوی - وەك ئەوانەی پێشوو - کۆچ دەکات و ناگەڕێتەوە!

هەموو ئەم شتانە و ڕەوتی ئەم کارانە، بە شێوەیەکی بێگومان، دەری دەخەن کە:

لە پشتی ئەم میوانخانە کاتی و.. گۆڕەپانە ئاڵوگۆڕ بووانە و.. لە دوای ئەم پیشانگا هەمیشە گۆڕاوانەوە، چەندین کۆشك و تەلاری هەمیشەیی و خانە و لانەی هەتاهەتایی و بەهەشت و گەنجینەی پڕاوپڕ (لە ڕاستی و ئەسڵ و بناغەکانی ئەم نموونانەی ئێرە) هەن، کە پادشا بۆ ڕەعیەت و میوانەکانی خۆی ئامادەی کردوون.

کەواتە ئیش و کارەکانی ئێرە، تەنها لە پێناوی ئەو پاداشتانەدان کە لەوێ ئامادە کراون و، پادشا لێرە ئەرك و فرمان بە ڕەعیەتەکەی دەسپێرێت و لەوێیش پاداشتیان دەداتەوە. ئنجا هەموو یەکێ لەوان بەپێی توانا و لێهاتنی خۆی و بە گوێرەی ئەو کردەوە چاکانەی کە لێرەدا پاشەکەوتی کردوون، لەوێ بەجۆرە بەختەوەرییەکی تایبەتی خەڵات دەکرێت.

❑ وێنەی حەوتەم:

وەرە! با کەمێ بەناو کەسانی میللی(مەدەنی)ی ئەم وڵاتەدا بگەڕێین و هەندێ سەرنجی باری ژیان و دەوروبەریان بدەین..

بڕوانە! وا لە هەموو گۆشەیەکدا چەندین کامێرای وێنەگرتن دانراون، وێنەی شتان دەگرن و، لە هەموو شوێنێکدا کەسانی نووسەری زۆر هەن کە گشت شتێك، تەنانەت شتە کەم بایەخەکانیش، تۆمار دەکەن..

فەرموو سەیری ئەو چیا بەرزە بکە، ئەوەتا کامێرایەکی گەلێ مەزنی لەسەر قایم کراوە کە تایبەتە بە پادشا خۆیەوە[1]، وێنەی هەموو ئەو شتانە دەگرێت کە لەم وڵاتەدا ڕوو دەدەن، چونکە پادشا فەرمانی داوە کە سەرجەمی ئەو شت و کاروبار و مامەڵانەی لەناو وڵاتەکەیدا ڕوو دەدەن تێکڕا تۆمار بکرێن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە پادشای مەزن خۆی نەخشەی ڕووداوەکان دەکێشێت و فەرمان بە تۆمارکردنیشیان دەدات..

جا ئەم بایەخدانە گرنگ و پارێزگاریەیە وردەی شتانی ناو وڵات - بێ هیچ گومانێك - بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە: هەموو هەڵسوکەوت و ڕەفتارێك لێپرسینەوەی لە دوا هەیە. چونکە ئایا دەگونجێ فەرمانڕەوایەکی پارێزگار کە سادەترین مامەڵەی بچووکترین ڕەعیەتی خۆی پشتگوێ نەخات، کارە مەزنەکانی ڕەعیەتە گەورەکانی نەپارێزێت و تۆماریان نەکات و لەسەر کردەوەکانیان لێیان نەپرسێتەوە و پاشان سزایان نەدات؟ لە

---

(١) هەندێ لەو واتایانەی کە ئەم وێنەیە ئاماژەیان بۆ دەکات، لە "ڕاستیی حەوتەم"دا ڕوون دراونەتەوە. بۆ نموونە ئەو کامێرا مەزنە تایبەتیەی پادشا، ئاماژە بۆ "لوح المحفوظ" و ڕاستیی ئەو لەوحە دەکات. ئنجا وتەی "بیست و شەشەم"یش "لوح المحفوظ"ی چەسپاندووە و، بوونی ئەو لەوحە بەمەی خوارەوە چەسپاوە:

هەروەك ناسنامە کەسیەیە بچووکەکان هێمان بۆ بوونی تۆمارێکی مەزنی ناسنامەکان و.. قەواڵە بچووکەکانیش دەری دەخەن کە تۆمارێکی مەزن هەیە هەموو قەواڵەکانی تێدا تۆمار کراوە و.. نمە وردیلەکانی دڵۆپە بچووکەکانیش بەڵگەن لەسەر بوونی کانیاوێکی مەزن.. هەروەك ئەمانە وان، بە هەمان جۆریش یەكبەیەکی: هێزی پارێزەر(حافظة)ی مرۆڤ کە زانیاریەکانی مرۆڤی تێدا دەپارێزرێن و.. بەری درەختەکان و.. تۆوی بەرەکان، وەك ناسنامەی بچووك وان و، لە واتای چەند "لوح المحفوظ"ێکی بچکۆلەدان و، لە شێوەی چەند نمێکی هەندێ دڵۆپی بچووکدا دەردەکەون کە نم نم لەو پێنووسەوە داچۆڕاون کە "لوح المحفوظ"ی مەزنیان پێ نووسراوە. لەبەر ئەوە، هەموو یەکێ لەمانە مرۆڤ وا لێ دەکەن کە بە بێ گومانی هەست بە بوونی "حافظة"یەکی مەزنتر و، تۆمارێکی گەورەتر و، لەوحی مەحفووزی هەرە مەزن بکات و، ئەمانەی بۆ دەچەسپێنن و بۆ عەقڵە تیژە بێدارەکانیان دەخەنە ڕوو. (دانەر)

کاتێکدا کە ئەو گەورە ڕەعیەتانەی ڕەفتاری وایان لێ دەردەکەوێت کە یەخەی مەزنیی ئەو دەگرێتەوە و، میهرەبانیی فراوانیشی دەست بە ڕووی ئەو ڕەفتارانەیانەوە دەنێت؟!

جا مادەم ئەوانە لێرەدا لەسەر کردەوەکانیان سزا نادرێن، ئەوا - بێ گومان - سزاکەیان بۆ دادگایەکی گەلێ مەزن دواخراوە.

❐ وێنەی هەشتەم:

وەره! با ئەو فەرمانانەت بۆ بخوێنمەوە کە لە لایەن پادشاوە دەرچوون.. بڕوانە! وا پادشا "بەڵێن" و "هەڕەشەکانی" پەیتا پەیتا دووپات دەکاتەوە و ڕایدەگەیەنێت کە:

(دەتانهێنم بۆ مەڵبەندی پادشایی و دەستەڵاتداریی خۆم و، بەختەوەری بە گوێڕایەڵانتان دەبەخشم و، سەرکەشانیشتان لە بەندیخانەدا توند دەکەم و، ئەم شوێنە کاتی‌یەش دەڕووخێنم و وڵاتێکی تری نوێ بنیات دەنێم کە چەندین کۆشك و تەلاری هەتاهەتایی و بەندیخانەی هەمیشەیی تێدا بێت).

ئەوەش بزانە کە جێبەجێ کردنی ئەم بەڵێنە بە لای پادشاوە گەلێ ئاسانە و، لە هەمان کاتدا تابڵێی گرنگ و جێی بایەخیشە بۆ ڕەعیەتەکانی. ئنجا نەبردنەسەری بەڵێن کارێکە بە یەکجاری پێچەوانە و دژی عیززەت و توانستی پادشایە.

دەسا ئەی هاوڕێی بێ ئاگام!

تۆ چەندە سەیریت! دەچیت درۆ و دەلەسەکانی وەهمی خۆت و وڕێنەکانی عەقڵت و فێڵ و تەڵەکەکانی نەفست بە ڕاست دەزانیت، کەچی تەسدیقی ئەو کەسە ناکەیت کە هەرگیز ناچاری بێ وەعدی نابێت و بە هیچ جۆرێك توخنی بەڵێن شکاندن ناکەوێت و هەموو شتێك شایەتی لەسەر ڕاستیی ئەو دەدات.

